چۆنێتی كوشتنی لـه ئەنجامـدا وا دەركـەوت كـه خنكێنـراوه وبەیـەك جـاری تاوانەكه ئاشكرا دەبێت، وه (عمر) اعتراف لەسەر شۆفێرەكه دەكات كەناوی (ئاری)یه بەلأم شـوێنی نادیـار دەبێـت ، پـاش لیٚ كۆڵینــەوه لـەتاوانی (عمـر) لەلایەن دادگـاوه حـوكمی لـه سـێدارەدانی بـۆ دەردەچـێت بـەلأم بەداخــەوه تائەوكاتەی عمریش لەسێداره دەدرێت تاوانباری دووەم ناو و ناونیـشانی بـه نادیاری دەمێنێتەوه .

## ٣- رووداوی سیٚ یەم:-

ئافرەتیٚ كه نێچیری دەستی یـەكێك لەوگورگانـه بـووه ، باسـی ژیـانی خـۆی دەكات لەسەرەتای كارەكەیـەوه تـا كۆتـای كەچـی بەسـەردا هـاتووه ، ئـەم ئافرەته دەڵێت پێش شەش مانگ لەئەنجام دانی كارەكه ، حەزم له گـەنجێك كرد، كەڕاستی ئەو حەزكردنه لـه نـەزەرێكی ئاسـاییەوه دەسـتی پـیٚ كـرد ، دوای ماوەیەكیش گۆڕا بۆ لێك نزیك بوونەوه ، دوای ئەوەش بۆ قـسەكردن و گفتوگـۆ ، بـەردەوام قـسەی زەردو سـورمان بـۆ یـەكتری دەكـرد پەیوەنـدی بەناوه (هاوڕێیەتیمان) ، تادەهات خۆش تر دەبوو، تابەشێوەیەك پەیوەندی نێوانمان پـەرەی سەندكەزۆرترین كاتەكانی ڕۆژانەمان بەیەكەوه بەسەردەبرد ، شەرم دەكەم كه بڵێم وامان لێهات لەگەڵیدا دەڕۆشتم بۆیەكێك لەو خـانووه ئاماده كراوانەی كه خانووی یەكێك له هاوڕێكانی بوو، پاش ماوەیـەكیش لـه هاتووچۆكردنی ئەو خانوو چۆڵه بەبـەردەوامی وای لیٚكـردم حـەز بەوشـوێنه بكەم ، چونكه له چاوی خەڵكی به دوور بـووین ، تـا ئـەو گورگـه تـوانی زۆر بەئاسـانی قـایلم بكـات بـەوەی ئـەم شـوێنه شـوێنێكی داخـراوەو دەتـوانیٚ بەئاسانی بمانپارێزێت له چاوی ئەو كەسەی كـه دەترسـاین بمـان بیـنن، كـار بەم شێوەیه مایەوه تائەو كاتەی خۆم لـەبیر كـرد، دایـك و بـاوك ، خوشـك و

برا، هاوڕێ و دۆستانم لەبیر كردو بەم شێوەیە لە گەڵیدا گونجام ، چونكە من بەراست ئەو كوڕەم خۆش دەویست ، وەلەو قەناعەتـەدابووم كـە ئـەو كـوڕە بـەهۆی ئـەو وەعـدو بـەڵێن و قـسەیەی كـە بـۆی دەكـردم و دەیڕازانـدەوە بەڕاستی خۆشـی دەوێـم ، بۆیـە مـن بەتـەوای بـڕواو متمانـەم پـێ كردبـوو ، چونكە پێشتر بەڵێنی دابوو كەبێتە خـوازبێنیم بمخـوازێ ، ڕۆژگـار دەڕوات و هاتووچۆی ئێمەش بۆ ئەو شوێنە بەتەنها بەردەوامە ، هاوار ...هاوار...بۆمن ، تاڕۆژێكیـان ئـەم گورگـە زۆر بەئاسـانی پـەلاماری دام و منـیش بـەبێ هـیچ بەرگرییەك خۆم تەسلیمی كرد، تا ئەو كاتەی مەرامە بۆ گەنەكەی خـۆی تێـر كردوو منیشی هەڵدایە زبڵدانی بێڕێزانـەوە ، بـەڵێ مـن شـەرەف و نـاموس و ئەخلاق و سەربەستی خۆم بەدیاری پێشكەش كردوو ژیانم دۆڕاند ، بەڕاستی دۆڕاندی هەمیشەیی .....پاش تەواو بوونی كارەكەمان هەستم بەلاوازی و بێ دەســەڵاتی خــۆم كــرد ، ئێــستا گرەفتەكــە لەوەدایــە كــە مــن داوا لەخۆشەویستەكەم دەكەم كە بێتـە خـوازبێنیم ، بـەلام پـاش چـی ؟ . پـاش ئــەوەی لەكارەكــەمان تــەواو بــووین و كوڕەكــەش هەڵــدێ و بۆهەتاهەتایــە نایـەوێت بم بینـێ ، وە ئێستاش منـی دامـاو لـە دۆزەخێكـی پـڕ لـە تـرس و بێزاریـدا دەژیـم و نـازانم چـۆن ڕەفتـار بكـەم ، لـە گـەڵ ئەوەشـدا نـاتوانم بەرەنگاری كەس و كارەكەم ببمەوە ، چونكە ئەوان متمانەی تەواویان پێمـە سەرەڕایی ئەوەی كە (٢٧)ساڵ تەمەنمەومنداڵ نیم........

**بەڕێزەكانم :**

پاش ئەوەی سێ ڕوداوی ڕاستەقینەت خوێندەوە كە مشتێكن لە خەرمانی ئەو ڕووداوانەی كەڕۆژانەو بەردەوام دووبارەدەبنەوەو هەرجارەی كۆمەڵێك لە كچان و ئافرەتانی داوێن پاك دەبنە قوربانی،وە سوكایەتی بەهەست و شعوریان دەكرێت وسەرئەنجامیش یان كوشتن یان سجن كردن یان لەش فرۆشتن بەرۆكیان دەگرێت ودەبێت قایلیش بن بەو ژیانەودوای ئەوەش هەمیشە بەداوین پیس و بەد ئەخلاق باس دەكرێن ، پێویستە لەسەر تۆی بەڕێز بەردەوام لە هەوڵی پارێزگاری كردن لە خۆتدا بیت لەهەموو ڕووە كانەوە ،چونكە زۆرن ئەوانەی كە وەسفت دەكەن وخۆیان بە خزمەت كارت دەزانن تا ئەو كاتەی كە كاریان پێتە ، لە هەمان كاتدا كەمن ئەوانەی كە بەڕاستی دڵسۆز و خەمخۆری ڕاستەقینەی تۆن ، جا من وای بە پێویست دەزانم كە بەڕێزتان بگەنە ئەو قەناعەتەی كە خۆتان بتوانن خزمەت كارو خەم خۆرو دڵسۆزی خۆتان بن بەیارمەتی لەگەڵ ئەوانەی كە یارمەتی دەرو پشتیوانی تۆن بە هەرئەندازەیەك بێت بەڕێزان حەزدەكەم پێكەوە لێكۆڵینەوە و شیكاریەك بكەین بۆ ئەو ڕووداوانەی كەبەسەر ئەو سێ كچە داوێن پاكەداڕوویدا كەئەنجامێكی خراپی لێكەوتەوە،بەڕێزان هەمووومان دەزانین كە هەموو ڕووح لەبەرەكان هەست وغەریزەی جنسیان هەیە وكەم بێت یان زۆر بەتایبەتی تر لە توێژی مرۆڤەكاندا بەڕوونی هەستی پێ دەكرێت، بەڵام ئەم توانایە لەكەسێكەوە بۆكەسێكی ترجیاوازە بە جیاوازی ئەو هۆكارانەی كەدەبنە هۆی بەرزو نزمی ئەو توانایە لە مرۆڤەكاندا،وەهەروەها زاڵ بوونیش بەسەر ئەوغەریزەیەدا دیسان لە نێوان كەسەكاندا جیاوازە، وە بەكارهێنانی ئەو غەریزە یەش ودەربڕینی لە لایەن كەسەكانەوە وەك یەك نیە ، بۆیە ئەگەر بەشێوەی خراپ دەربڕێ ئەنجامی

خراپی لێدەكەوێتەوە و بكەرەكەشی زۆر پەشیمان دەبێتەوە و هەست بە ئازارو ئەشكەنجەی ویژدانی دەكات،چونكە( كاری هەڵە لەئەسڵدا لەگەڵ سروشتی مرۆڤەكاندا نەگونجاوونەخوازراوە) بەلاَم ئاگاداربە بەردەوام بوون لەسەر كاری هەڵە پەشیمانی و نیگەرانی و ئازارو ئەشكەنجەی ویژدان ناهێڵێت،كاری هەڵە ئەنجام دان دەبێت بەبەشێك لەكاروبارەكانی ڕۆژانەی زۆر لای ئاسان دەبێتەوە ، بەلاَم هەركاتێ هەستت بەهەڵەكرد و زوو پەشیمان بوویتەوە لەو هەڵەیە ئەو كات دەبیت بەسەركەوتووترین كەس وداناترین كەس چونكە كەسی داناو سەركەوتوو ئەو كەسەیە كەسودوپەند لەهەڵەكانی وەربگرێت وجارێكی تر ناگەڕێتەوە سەری ، باشە ئێستا با بپرسین ئایا بۆچی هاوڕێكانتان (ناسكەوشاگوڵ وفلاَن)تووشی ئەو هەڵەیە بوون؟ ئایا هۆكاری ئەو هەڵەیە چی بوو ؟ بەچی نیازیك رازی بوون بۆ ئەوەی خۆشەویستی بكەن؟ ئایا ئەو مەبەستە چی بوو كە خۆیان لە پێناوی دا دا بە كوشت ؟ ئایا گەشتن بە ئەنجام ؟ ئایا چۆن ژیانیان بە جێ هێشت بەسەربەرزی و بەختەوەری یان ڕسوایی و بێ ڕێزی ؟ ئایا باجی هەڵەكانیان تەنها خۆیان دایان یان كەس و كاریشیان ؟ كێ زەرەرمەندی یەكەم بوو؟.

بەڕێزەكانم وەلاَمی پرسیارەكان ئاسانن لای هەمووتان پێش ئەوەی هەڵەكانیش ئەنجام بدەن هەروەلاَمەكان دەزانن، بەلاَم كێشەكە لەوەدایە ئەی بۆچی ناجح نابن؟ بۆ سەر كەوتوو نابن بۆچی دەبێت ببب بەقوربانی، ئەزانن بۆ تووشی هەڵە بوون؟ چونكە سۆزداریان زاڵ بوو بەسەر ئەقڵ و بیركردنەوەیاندا دوور بین نەبوون لەكاتی دانانی پلانەكانیاندا تەنها بیریان لە خۆشی یە كانیان دەكردەوە و ناخۆشیە كانیان لە بیر كردبوو تە نها خۆیان مەبەست بوو جگە لە خۆیان لە بیر كردبوو، تەنها بڕیاری خۆیان لا گرەنگ بوو، بڕیاری جگە لە خۆیان لا پەسەند نەبوو، وە هۆكاری تووش بوون بە

هەڵەكانیان ئەوە بوو زوو بڕوایان كرد بە قسەو درۆكـانی خۆشەویستەكانیان بێ تێگەشتن بێ شارەزابوون بێ ناسین بڕیـاری خـۆ تەسـلیم بوونیـان دا بـێ ئەوەی لە مەبەستیان تێ بگەن وە بێ ئەوەی ماڵەوەیان ئاگادار بكەنەوە وە بێ ئەوەی بیربكەنەوە بێ ئەوەی بیر لە داهاتووی خۆیان بكەنەوە بە هەموو ڕێگەیەك ئامادە بوون بۆ ئەوەی رازی بن بەو خۆشەویستیە بۆیە سەرئەنجام ئەوە ڕوویدا كە نەبوو ڕووبدا، وە بە نیازی ئـەوەی كـە لـەداهاتوودا لـە گـەڵ پیاوی خۆیاندا ژیان بەسـەر بـەرن و خزمـەتی منـداڵانی خۆیـان بكـەن و بـەو هیوایە بگەن كە زۆر لە كچان خەونی پێ وە دەبینن كە ئەویش شـوو كردنـە بە كەسێكی چاك بۆیە حەزكردنیان بە شـووكردن وایـان لێ دەكـات كـە پەلـە بكەن بۆ ئەو كارە بۆیە زۆرجار كۆنترۆی خۆیان بۆ ناكرێ و بە ڕێگـەی هەڵـە دا دەڕۆن، ئەو مەبەستەی كە خۆیان لە پێناویدا دانا لەبەر دەوڵەمەندی یـان جوانی یان تێر كردنی غەریزەی جنسی یان بوولە گەڵ خۆشە ویـستەكانیاندا بۆیـە زۆر جـار كـچان بـە دەوڵـە مەنـدی یـان جـوانی یـان زیرەكـی كـوڕان هەڵدەخەڵتێن و زوو بڕیاری ئەوە ئەدەن كـە رازی بـن بـە خۆشەویـستییەكی درۆینــە،ئــەو ســێ كــچە لەگــەڵ ئــەوەی كــە رازی بــوون بــە هــەموو ئــەو ســوكایەتییەی كــە پیــان كــرا و ڕووزەردو ڕســوا بــوون لــە لایــەن خۆشــە ویستەكانیانەوە بەڵام نەگەشتن بەو ئەنجامەی كە ئەوان خەونیان پێ دەبینی بۆیە پاش ئەوەی ڕسواو سەرگەردان بوون كوشـتنیان وبـۆ هـەتا هەتایـە بـێ هیوایان كردن، لەگەڵ ئەوەی كە نەگەشتن بە ئامـانجی پـیرۆ زی خۆیـان كـە پێكەوە ژیان بوو لەگەڵ خۆشەویستەكانیاندا بە ڕسوایی و كاسە بەتاڵی یەوە سەریان نایەوەو مردن یان بەتەمایی مردنن، تەنها باجی هەڵەكانیان بەمردنی خۆیـان كۆتـایی نـەهات بـەڵكو بنەماڵكەشـیان بوونـە قوربـانی هەڵـەكانیان بنەماڵەیـەك تیاچـوون و بنەماڵەیـەكیش لـە چـاوەڕوانی تیاچـووندا بـوون

بنەماڵیەكیش لە چاوەڕوانیدان بۆ ئەوەی ڕسوابن بەڵاٚم هەركاتیٚ كچە بیست و حەوت ساڵەكەیان ڕسوا بێت كە لەنێوان ترس و مردندا دەژیت، زەرەرمەندی یەكەم خۆیان بوون پاشان بنەماڵەكەیان پاشان گورگەكان دوایی ئەوەش ئێوەن ئەگەر بەشوێن پیٚ ی ئەواندا بڕۆن و سود لەهەڵە كانی ئەوان وەرنەگرن كە بەهۆیەوە سەرگەردان بوون، بۆیە بەڕێزەكانم من دەمەوێت لەكۆتایی ئەم بەشەشدا ئەوەت پیٚ بڵێم كە هەرگیز لووت بەرز مەبە لەئاست وەرگرتنی قسەی ڕاست و دروستدا جا هەركەسێك پێت ڕابگەیەنێت بەمەرجیٚ سودبەخش و كاریگەربێت لەسەر ژیانت جا بەهەر زمانیك بوو لە هەرشوێنێكدابوو بەهەر مەبەستێك بوو بە جوانی خۆت بەشەهادەت بە دەوڵەمەندیت بە مەنسەبت بەزانست و زیرەكیت مەنازە و هەموو كات گوێبیستی قسەی ڕاست و باش بە بۆئەوەی تووشی هەڵەو كاری خراپ نەبیت، وەجارێكی تریش هیوادارم خویندنەوەی ئەم بەشەش گۆڕانكارییەكی لای بەڕێزت دروست كردبێت و تۆش لەو گۆڕانكاریە سودت وەرگرتبێت ............. بەهیوای هەمیشە سەربەرزیت



# باسی سێیەم: ئامۆژگاری

بەڕێزان پاش ئـەوەی دووبەشـی ڕابـردووی ئـەم نامیلكەیـەت خوێنـدەوە كـە بەشی (یادخستنەوە)و(ڕووداوەكان) بوو، ئێستا بەشی سێیەم دەخوێنیتەوە كە بەشی (ئامۆژگاری) یە، لەم بەشەشـدا هـەوڵمان داوە هەنـدێ ئامۆژگـاری بەڕێزتان بكەین بۆ ئەوەی ئێـوەی بـەڕێز تووشـی هەڵـەو كـاری خـراپ نـەبن بەهۆی كۆمـەڵێ هۆكـارەوە كـە دەروازەیـەكن بـۆ ئـەوەی لێیـەوە بـچنە نـاو دونیایی تاوان و سەرلێ شـێواوی یـەوە، هۆكارەكـانی هەڵـەو تـاوان زۆرن كـە بەرۆكی مرۆڤەكان بەگشتی و توێژی ئافرەتان بەتایبەتی دەگرێت، زۆریك لـە ئەو هۆكارانەی كە دەبنە هۆی ئەوەی كە مرۆڤەكان بەرەو هەڵەو تاوان ڕاپێچ بكـات نـەخوازراوەو لەدەسـەڵات و توانـای كەسـەكاندا نیـە وپـێ رازی نـین كەبەسەریاندا دێت، لەگەڵ ئەوەشـدا زۆر هۆكـار هـەن كـە مرۆڤـەكان خۆیـان بەدەستی خۆیان بـۆ خۆیانیـان دروسـت دەكـەن و بـەرەو كـاری نائاسـایی و نەخوازراو ڕایان دەكێشێت، جا كەسی زاناو دانا ئەو كەسەیە كە خۆی بەدوور بگرێت لە هەر هۆكارێك یان هەرشتێك كە بەرەو كێشەو دەردەسـەری بـەرێت لەهەر شوێنێكدا بێت یان لەهەر كـات و زەمانێكـدا بێـت، بـەڕێزان بـزانن كـە زۆرتـرین كێـشەی مرۆڤـەكان بەشـێوەیەكی گـشتی كـە بـەرۆكیان دەگرێـت سەرچـاوەكەیان بـەهۆی (شـەهوەت)یـان (پـارە)وەیـە، بۆیـە زۆربـەی ئەوانەیكەتووشی كێشەو دەردەسەری بوونە بـەهۆی (شـەهوەت)وە توێـژی ئافرەتـانن، چـونكە ڕێـژەی حـەزكردن بەشـەهوەت بـازی لـە ئافرەتانـدا زۆر زیاترە وەك لە پیاوان، بە پێچەوانەوە ڕێژەی حەزكردن بەپارە و كۆكردنەوە و هەڵگرتنی لە پیاواندا زیاترە وەك لە ئافرەتاندا، بۆیە پێویـستە ئامۆژگـاری بەڕێزتان بكرێت لـەو ڕووە وەكـە پێویـستان پێیـەتی كـە ئـەویش لـە ڕووی( شەهوەت)ەوەیە، چونكە كێشەو گرفتی ئێوە ئا لێرەوە سـەر هەڵـدەدات وە

پێویستە لەسەر کەسی چارەسەرکار پێش ئەوەی چارەسەرت بۆ دابنێت دەبێت لە کێشەکانت بگات ئەو هۆکارانە بزانێ کە سەرچاوەی کێشەکەیە، تا بتوانێ چارە سەرێکی چاك و سودبەخشت بۆ دابنێت و جارێکی تر تووشی کێشە نەبیت،بەڵێ بەڕێزەکانم وەکووتمان هۆکارگەلێکی زۆر هەن کەئێوەی بەڕێز تووشیکێشەوگرفت دەکەن، بە شێوەیەکی گشتی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن ڕادیۆ. تەلە فزیۆن، سەتەلایت، هەروەها ڤیدۆ سیدی، دیڤیدی، وڕۆژنامەکان و گۆڤارەکان وسایتەکانی ئینترنێت بە شێوەیەکی گشتی هۆکاری سەرەکی و کاریگەرن بۆ ئەوەی بەکارهێنەرانی تووشی کاری هەڵە و تاوان بکات وزیاتر لایەنی شەهوەتان بەرزدەکاتەوە، ئەگەر بەشێوەیەکی خراپ بەکارهێنران لەکاتێکدا دەبێت تۆ لەهەوڵی نزم کردنەوەی شەهوەت و حەزەکانتدا بیت، ئەمانە هۆکارە نەخوازراوەکانن، بەلام بەکارهێنانیان بەشێوەیەکی خراپ لەلایەن خۆتانەوەئەمە ئەو هۆکارانەیەکەخۆت بە دەستی خۆت دروستیان دەکەیت و بۆ ئەوەی بەرەو هەڵەت بەرێت، هەروەها بەڕێزان هۆکاری تریش هەن دیسان بەرەو خراپە کاری هەنگاوتان پێ دەنێن لەوانەش هاوڕێ ی خراپ و دوور لە رەوشت کە ئەمانەش ئەگەر ئاگاداریان نەبیت زیانتان پێ دەگەیەنن ولەبری ئەوەی یارمەتیتان بدەن بۆ ئەوەی تووشی هەڵە نەبن کەچی هانت دەدەن بۆ ئەو کارە، هۆکاری تر ئەوەیە کە ئێوە زۆربە ساویلکەیی دەڕواننەبەرامبەرەکانتان بێ بیرکردنەوە بێ تاقی کردنەوە بێ تێ گەشتن بڕیاری رازی بوون بە هەر کارێك دەدەن ئەگەر لە ئەنجامیشدا کوشتن یان سجن کردن یان ڕسوابوونیشی بە دواوە بێت، ئەم خاڵە ئێوەی کردوە بە بێ هێزترین کەس لای کوڕان ،.بۆیە زۆربەی کوڕانی ئارەزوو پەرست زۆربەی کات لەم دەرگایەوە هێرشتان دەکاتە سەرو ئامانجی خۆیان دەپێکن، هۆکاری تر کە بەرەو هەڵەت دەبات بێ کاریە، واتاخۆمەشغول

نەكردن بە شتێكەوەجالەماڵدا بێت لە خوێندنگەدابێت لە زانكـۆ و پـەیمانگادا بێـت لـە دائـیرەو فەرمانگەكانـدا بێـت لـە هەرشـوێنێكدا بێـت ، چـونكە خـۆ مەشغول نەكردن بەهیچ شتێكەوە بوار بەنەفس دەدات كە تووشی چـەندەها بیركردنەوەی سەیرو سەمەرەت بكات كە تەنها لەخەویك دەچێت لە ڕاسـتیدا بەلاَم دەتباتە ناو دونیایەكی ئەفسوناوییەوە كە تیایدا چەندە خەون و خەیاڵ داتـدەگرێت كـاتێكیش بـە ئاگادێیـت تەماشـادەكەیت كەتووشـی چـەندەها كێشەو گرفت بوویتە كەتوانایی چارەسەركردنیانت نابێت ئەمە جگـە لـەوەی تووشـی چـەندەها نەخۆشـی دەروونـی ڕەنگـە بەدەنیـشت بكـات، هـەروەها هۆكارێكی تر ئەوەیە زۆر جار كاتێك دەچیتە سـەربانی ماڵەكـەت یـان دێیتـە بەردەرگایی ماڵكەت یان كاتێك لەگەڕەكەكەتدا دادەنیشیت یان لە ناو زانكـۆ یان لە حەوشەی فەرمانگەكەت یان لەناو بازاڕ یـان لـەناو پاركـەكان و شـوێن گشتییەكانی وەك ناو پاص یان نەخۆشخانە دادەنیشیت جۆرە هەڵسوكەوتێك ئەنجام دەدەیت كە زۆرجار سروشتی نیە، بەئـەو هەڵـسوكەوتانەت سـەرنجی گەنجان بەلای خۆتادا ڕادەكێشیت تا ئەوكاتەی فێر دەبێت كە چۆن ئامانجی بپێكێ بەڕێزیشت هیچ چارێكت نـامێنیّ جگـە لـە ڕازیبـوون بـۆ خواسـتەكانی ئەودیارە ئەویش ئامانجێكی هەیە لەو خۆ مەشغولّ كردنەی پێتەوە هەركاتی مەبەستی پێكا كاری ئەو تەواو دەبێت لە كۆتایشدا دەبێت خۆتان باجی ئـەو هەلاّنە بدەن، هەروەها بەڕێزان هۆكارێكی تر لەئەو هۆكارانەی كە سەرچاوەن بۆ ئەوەی بەرەو هەڵت بەرن ئەوەیە كاتێك لە ماڵ دەردەچیت بۆ بازاڕ یان بۆ فەرمانگە یان بۆ زانكۆ یان بۆ سەردانی كەسێكت یـان هـاوڕێ یـەكت جـۆرە پۆشـاكێك لەبـەر دەكـەیت كـە گونجاونیـە لـە گـەڵ دینەكـەت یـان عـورف و عادەتی كۆمەڵگەكەت، نە لاشەت بەئەو پۆشاكە ئیسراحەت دەكات نە نـاخ و ویژدانیـشت پیّـی خۆشـە، بـەم شـێوەیە بەرامبەرەكـەت بـۆت دەڕوانـیّ

وچەندەها تەعلیق و تانەوتەشـەرت تـێ دەگرێـت، تـۆش پـاش چـەند جـارێ تەعلیق وەشاندن لێت ئەو كارەت لا ئاسایی دەبێت كە وای لێ هات ئـەو كـات دەبیت بەماڵ بۆیان تا وات لێ دەكەن بـەرەو هەڵـەت بـەرن، ئـەوكات تـووش دەبیت و مەجبوریش دەبیت بەردەوام بیت لەسەر كاری نائاسایی و هەڵە، بە رێزان هۆكارێكی تر ئەوەیە زۆر جار بەهۆی لێك تێ نەگەشتنەوە لـە یـەكتری لە گەڵ هاوسەرت یان لەگەڵ ماڵەوەتان بە شەڕ دێیت ولەیەكتری زویر دەبـن و سـەرئەنجام لێیـان دوور دەكەویتـەوە و بـیر لـە هـەڵهاتن دەكەیتـەوە بـۆ شوێنێكی نەخوازراو،پاش ئەوەی كە چاوی هاوسەرت یان ماڵەوەتان لەسـەر نامێنێـت ئـەوكات كـاتێكی شـیاوە بۆتـان تـا بـیر لـە تـاوان و كـاری هەڵـە بكەنەوە،ئەمەش بۆ ئەوەی بژێوی ڕۆژانەت دەست بكەوێت یان ئەوەتا كاری سـوالكردن دەكـەن یـان فێـری لـەش فرۆشـی دەبـن، بـەڕێزان ئەمـە سەرئەنجامەكەیەتی بۆئەوەی زیاتر دڵنیا بیت ڕووداوی ئەوكەسانە بخوێنەوە كە تووشی لەش فرۆشی بوونە، دەبینیت ئەوانە زۆربەیان بەهۆی كێشەیەكی خێزانـی كـە لـە نێوانیـان دا ڕوویـداوە تـووش بوونـە مـەرجیش نیـە خۆیـان بـەوكارە ڕازی بـن، هۆكـارێكی تـر ئەوەیـە كـە بـەڕێزتان شـەرم ناكـەن لـە ماڵەوەتان و ترستان لە لێدان و قسە پێ وتن و ئابرۆ چوون نییە، بۆیە زۆر بە ئازادانە هەوڵی ئەوەدەدەیت كە بەهەر ڕێگەیەك بیت حەزو ئارەزووەكانت تێر بكەیتبەلأمدواییئـەنجام دانـی كـاری هەڵـە پەشـیمان دەبیتەوەكـە ڕەنگـە سودیـشی نـەبێت بـۆت، هۆكـارێكی تـر ئەوەیـە بـیر كردنـەوەی سـەیر سەیردەربارەی خۆت داتبگرێت بۆ نموونە بترسی لەوەی كە تـۆ گـەورەبووی ئیتر كەس نایەتە خوازبێنیت وكەس تۆی ناوێت لە ئەنجامـدا دەبیتـە گـەورە كچ ودەمێنیتەوە،بۆیە دەڵێیت لە ئێستاوە هەوڵدەدەم بۆ ئـەوەی شـووبكەم ئیتر گوێ بەوە نادەی كە ئایە بەچ ڕێگەیەك و چۆن هەوڵ بدەیت،كام ڕێگەیە

دەتگەیەنێتە ئامانج! كام رێگەش مەویستت دەكات،هۆكارێكی تر ئەوەیە كە مرۆڤەكان بەگشتیوتوێژی ئافرەت بەتایبەتی هەرگیز بیر لە ژیانی پاش مردن ناكەنەوە ترسیان نیە لەو سزاو تۆڵەیەیی كە لە دینەكانیاندا بۆیان دانراوە لەبەرامبەر ئەنجامدانی كاری هەڵەو لەهەمانكاتیشدا حەز بەو خۆشیە نەبڕاوانە ناكەن كە بۆ كەسی باش و چاك دانراوە كاتێ كاری جوان و چاك ئەنجام دەدات بە كورتی خاوەن دینەكان نە لە سزایی ئاگر دەترسن كە كاتێ كارێكی هەڵەو تاوان ئەنجام دەدەن نە ئومێدی پاداشتی گەورە دەكەن كەكاتێ كارێكی باش و چاك ئەنجام دەدەن ،تەنها هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی ئامانج لەیەك لاوە(تەنها لە دونیادا)وەوفەرامۆشكردنی لایەكی تر، توێژەكانیكۆمەڵ بەرەو بیری تاك لایەنانە دەبات، كە هەركاتێكیش لەیەك لایەوە ڕووانیت بۆ دەوروبەر ئەوكات دەكەویتە هەڵەیەكی گەورەوەو چارەسەریشی زۆر ئاسان نابێت لە داهاتوودا ، بۆیە ئەم خاڵەش دیسان دەتوانی وەكو هۆكارێك بۆ ئەنجام دانی كاری هەڵەو گوێ پێ نەدانی هەژمار بكرێت ،، بەڕێزەكانم هۆكاری تر زۆرن بۆ ئەوەی كە مرۆڤەكان بەرەو هەڵە بەرن بە تایبەتی تر ئافرەتان بەلأم ڕەنگە من تەنها دركم بەئەمەندە هۆكار كردبێت لەم كاتەدا كە خەریكی نوسینی ئەم پەرتووكەم بەلأم ڕەنگە بەڕێزتان زۆر هۆكاری تر بزانن كە سەرچاوەیە بۆ ئەنجام دانی كاری هەڵە لای ئافرەتان و ئێمە نەیزانین،بەلأم گرنگ ئەوەیەبەهەردوو لامان هەوڵ بدەین شارەزابین لەئەو هۆكارانەتابتوانین (پاش دراسە كردنو لێكۆڵینەوە)، چارەسەرێك و پلانێكی بەسودی بۆ دابڕێژین وئافرەتان لەو قەیرانانە ڕزگار بكەین كە ڕۆژانە دووچاری دەبێت، بۆ ئەوەی چیتر لاشەی ئەوان بازرگانی پێ وە نەكرێت و لەڕیزی مرۆڤایەتی وەدەرنەنرێت وبە هۆی هەڵەی نەخوازراوەوە تووشی كوشتن و سجن كردن و دەربەدەریو ئازارو ئەشكەنجە

وسوكایەتی پێكردن نەبنــەوە، دیـارە ســەركەوتی ئێمــەش كـاتێ دەســتەبەر دەبێت كە چارەسەرەكانی ئێمە لەجێگەی خۆیدا بێت بـۆ كێـشەكان و وەڵام دانەوەی ئافرەتانیش بۆچارەسەرەكان بەپەلە بێت، بەڕێزەكانم پاش ئەوەی زۆر هۆكارمـان زانیكـە دەبنـە هـۆی ئەنجامـدانی كـاری هەڵـەو نائاسـایی لـە توێژی ئافرەتانـدا و زۆرێـك لـە كێـشەو گرفتـەكانیانمان زانـی،، كـاتی ئـەوە هاتووە كە پێكەوە چارەسەرێك بۆ ئەوكێشەو گرفتانە دابنێین و هەوڵ بدەین ئەو هۆكارانەی كە سەرچاوەی هەڵە و كاری نائاساییە لای ئافرەتان نەیهێڵین یان ( لەرووە خراپەكانیانەوە بۆ رووە باشەكانیان بیـان گـۆڕین)،بـۆ ئـەوەی زۆرێك لە هۆكارەكان كە لە ئەسڵداشتێكی باشن لەبەرچاویان نەكەون لەلایەك وبەشێوەیەكی جوانتر بەكاری بهێنن گەر شـێوە باشـەكانیان زانـی لەلایـەكی ترەوە، گەر ئافرەتان بە بیركردنەوەیەكی ڕاست گۆیانـە بیریـان كـردەوە لـە ژیانی خۆیان پاش ئەوەی هەڵەكانیان پیشان دراو كێـشەكانیان خرایـە ڕوو و چارەسەرەكانیشیان بۆ دانرا وە پەشیمانی خۆی دەربڕی لەكارە هەڵەكانی و هەوڵی دا چارەسەرەكان جێ بەجێ بكات ئەو كات ئومێدی زۆر كاری گەورەو سودبەخشی لێ دەكرێت لـە داهـاتوودا، وەدەتـوانی وەكـو مامۆسـتایەك یـان كەسێكی تێگەشتوو پرسیاری ئاراستە بكرێـت، چـونكە ئـەو بـە هـەموو ئـەو قۆناغانەدا تێپەڕی كردوە و هەمووی تاقی كردۆتەوە پاش دڵنیا بوون بڕیاری پەشیمان بوونەوەی داوە، وە بش زانن كە ﴿كەسێك تامی تاڵی نە چەشـتبێ قەدری شرینی نازانێ﴾، لە بەر ئەوە هەوڵ دەدەین چارەسەر بۆ كێشەكانتان دابنێنن تا ئێوە و هەموو ئافرەتانی دونیا لە زەلكاوی تاوان و تاوان كارییەوە بۆ باخچەی ئومێد و پڕ هیوا هەنگاو پێ بنێین ،بەڕێزان پێـشتر باسمـان كـرد كە یە كێك لە هۆكارەكان كە خەڵكی و بە گشتی و توێژی ئافرەت بە تایبەتی تووشی هەڵەو تاوان دەكات كەناڵەكانی ڕاگەیاندن و ئامێرە پێشكەوتووەكانی

سەردەمن،بەڵێ بەڕێزان ئەمانە هۆكار گەلێكن گەر نەتزانی بە شێوەیەكی باش بەكاریان بهێنی زۆر زیانت پێ دەگەیەنن وبەرەو ئەنجام دانی كاری هەڵە راپێچت دەكەن،ئەگەر تۆ تەنها لە رادیۆدا گوێبیستی گۆرانی بیت و لە تەلەفزیۆنیش سەیری گۆرانی و كلیپی گۆرانی بێژان لەگەڵ بەرنامەی نابەجێ بكەیتو لە سەتەلایتیشدا تەماشای فلم وبەرنامەی ڕەوشت ڕووخێن بكەیتو لە ڕوژنامەو گۆڤارەكان و پەرتووكوكاندا بابەتی خراپ و بەد رەوشتی بخوێنیتەوە و لە ئینتەرنێتیشدا ماڵپەرە خراپ و بێ ڕەوشتەكان تەماشا بكەی و ڕوژانەش لە ماڵەوە كاسێتی بێ سودو بێ كەڵك بە( سی دی) و(دی ڤی دی) تەماشا بكەی ، ئەوكاتە تۆ دەبیت بە دیلی دەستی ئەم بەلآیانەوناتوانیبەرەنگاریان ببیتەوە، تا لە دانەیەكیان خۆت ڕزگاردەكەی دانەیەكی تریان بەرۆكت دەگرێت،پاش ئەوەی كەنەتتوانی بەرامبەریان خۆ ڕابگری ئەوە كاریگەرییەكی زۆر توندو خراپت دەكەنە سەرو بەرەو سەدەها تاوان و هەڵەو كاری نائاسایی پەلكێشت دەكەن و سەدەها كێشەو گرفت و بەلآت تووش دەكەن و بەشێوەیەك كە هیچ تواناو دەسەلآتت ناهێڵن تەنانەت بۆ بیر كردنەوە بۆ خۆدەرباز كردن لە كێشەكانت، بەڕێزان ئێمە ناڵێین بە هەموو شێوەیەك نزیكی ئەم ئامێرانە مەكەونەوە بەلآم ئەوە دەڵێین كە بە شێوەیەكی وا بەكاریان بهێنیین كە زیان بۆ ئەخلاقیات و شەخسیات و كەسایەتیتان دروست نەكات، وە لایەنە باشەكانیان بە كاربهێنین چونكە سەدەها لایەنی باشەیان هەیە گەر ئێمە مەبەستمان بێت،بەڕاستی ئەمرۆ لە دونیادا دەزگاگانی ڕاگەیاندن بە دەسەلآتیچوارەم ناوزەند دەكرێت لەبەر ئەو كاریگەرو دەسەلآتەی كە هەیەتی، ئێمە لە قەدرو چاكەی ئەم ئامێرانە دانا گرین بەلآم لە هەمان كاتدا بە مەترسییەكی گەورەو كاریگەر دەیناسێنین ئەگەر نەتوانرا سودلەلایەنەباشەكانی وەربگیرێت بۆیە بەڕێزان بائاگاداربین لە

بەكارهێنانیان ئەوەندە سەرسام نەبین پێیان و ئەوەندەش لامان بێ ڕێز نەبن كە هیچ بایەخێكیان نەمێنێت، بۆیە بەڕێزان بە كورتی چارەسەر بۆ ئەم هۆكارە بەكارهێنانی ئەم ئامێرانەیە بە شێوەیەك كە بگونجێت لەگەڵ ئەقڵیات و شەخسیات و كەسایەتی مرۆڤەكان لەلایەك لە گەڵ ئاین وعورف وعاداتی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگەدا لەلایەكی ترەوە بە شێوەیەك ناخت و ویژدانت سەلامەت بێت لە كاتی بە كارهێنانیاندا ،،، هۆكارێكی تر هاوڕێ ی خراپ بوو، بەڕێزان ئێمە دەزانین كە ناتوانرێ تا سەر بە بێ هاوڕێ و برادەر بمێنیتەوە،چونكە تۆكاتێك لەناو كۆمەڵگایەكدا دەژیت تووشی چەندەها ڕووداو و كێشەی دەروونی وبەدەنی دەبیت لەماوەی ژیانتدا بۆ ئەوەی بەسەر ئەوكێشەو گرفتانەدا زاڵ بیت پێوست دەكات كە كەسێك هەبێت گوێت بۆ بگرێت یارمەتیت بدات ڕزگارت بكات لە كێشەكانت دڵ نەواییت بكات،دیارە باشترین كەسیش كە ئەم سیفەتانەی هەبێت پێش ئەوەی هیچ كەسێك بێت (هاوڕێ ) یە ، چونكە هاوڕێ ئەو كەسەیە كە زیاتر لە هەموو كەسێك دەتوانی لە كێشەكانت بگات و هەرئەویشە كەدەتوانی زۆرێك لە كێشەكانت بۆ چارە سەر بكات،بەڵام كێشەكەلەوەدایە ئایا ئەوكەسەی كە تۆ هەڵیدەبژێری بە هاوڕێ شیاوی ئەو پۆستەیە كە تۆ پێ ی دەدەیت ؟؟ خاوەنی ئەو سیفەتە چاكانەیە كە پێویستە لە هاوڕێدا هەبێت ؟؟ چونكە بەواتایی ووشە هەریەك لە ئێمە هاوڕێ ی زۆرە و بەڵام بەواتایی كردەوە هاوڕێ ی كەمە، بۆیە زۆر هاوڕێ هەیە كە زۆتر لە دوژمنێكی سەرسەختت دەچێت وەك لەوەی لە هاوڕێت بچێت ئەوەی كە كاریی خراپ نەبێت پێت ناكات ڕێگەی خراپ و تاوان كاریت نیشان دەدات پێش ئەوەی كاری باش و چاكت نیشان بدات ، بۆیە بە ڕێزان پێویستە بزانی كە هاوڕێكانت كێن لە كام كۆمەڵەن چونكە هاوڕێ ی خراپ جگە لە خراپە كاری و تاوانكاری هیچی تری

لێ ناوەشـێتەوە بۆیـە بـەرەو تاوانكـاری بانگێـشتت دەكـات ، بـە كـورتی چارەسەر بۆ ئەم هۆكارەش ئەوەیە هاوڕێ خراپەكانت فەرامۆش بكـە ئەگـەر زۆر نزیكیشن لێتەوە ، وە هاورێ باشەكانیشت بایەخ پێ بدە ئەگەر دووریشن لێتەوە چونكە ئەمە ڕێگەی خۆشبەختی تۆیـە لـەداهاتوودا ،،هۆكـارێكی تـر ئەوە بوو كە بەڕێزتان زۆر بە سادەیی و سانایی بیر دەكەنەوەو بڕیاری خێرا دەردەكەن بۆ كارەكانتان لە كاتێكدا ئەگەر زیانیشی هەبێت بۆتان ، بە ڕێزان ئەم سیفەتەتان زۆر خراپە پێویـستە ئاگـاداری بـن ، ئەوەنـدە خـۆش بـاوەڕ مەبن و یە كسەر بە قسەی بەرامبـەرەكانتان بـاوەڕ مەكـەن،بـە تایبـەتی تـر كوڕان چونكە ئەوان زۆر زۆر فێڵبازو زمان لوس و قسە زانن، دەزانن لـە چـی دەرگایەكەوە بۆتان دێن،چونكە هەریەك لە ئێمە خاوەن ئەقل و خاوەن بیرە توانایی بیر كردنەوەمان ئەگەر بیكەینە كار زۆرە بۆ ئەوەی لە چوار دەورمان تێ بگەین، بە ڕێزەكانم بۆ ئەوەی لـە نـاخی بەرامبەرەكـەتان تێبگـەن ئـەوە تاقی یان بكەنەوە بە هەموو شێوەیەك ئەگەر لە تـەواوی تـاقی كردنـەوەكان سەركەوتوو بوو ئەوە دەشێ راستگۆ بێت لـە گەڵتـدا لـە داهـاتوودا بـۆ هـەر مەبەستێ كە تۆی لە پێناویدا دەوێـت، بـەڵام گـەر سـەركەوتوو نـەبوو ئـەوە دەسـت بـە جـێ لێ ی دوور بكـەوە چـونكە ڕەنگـە ئـەوە گورگێـك بێـت لـەو گورگانەی كە لە پێـستی مرۆڤـدا خـۆی حەشـار داوەو چـاوەڕێ ی هەلـە بـۆ ڕاوكردنت،كەواتەبەڕێزان چارەسەر بۆ ئەم هۆكارەش ئەوەیە كە بە سـادەیی و ساویلكەیی بیر مەكەنەوە دەربارەی هەموو شتێ، بەڵكو زۆر بە جوانی و بە هێواش و ئاقڵانە بیركردنەوەكانت دەستپێ بكەو پـاش دڵنیـا بـوون لـە سـود وەرگرتنت لەبیركردنەوەكانت و كۆتایی ئـەو كـارەی كـە بـیرت لێ كردۆتـەوە بڕیاری گونجاو وكۆتایی بدە، دڵنیا بن بەبێ تاقی كردنـەوەش نـاتوانن پلـەی یەقین و دڵنیایی بە دەست بهێنن چونكە (تاقی كردنەوە باشترین بەڵگەیە)،،

ئافرەتانی داوێن پاك یەكێكی تر لەهۆكارەكان (بیٚ كاری ) بوو، بەڕاستی ئەم هۆكارەش كاریگەرییەكی نەگەتیڤانەی هەیە لەسەر هەموو كەسیٚ، بەتایبەتی توێژی ئافرەتان، چونكە ئافرەتان كەمتر دەردەچن لەماڵ وزۆرترین كاتەكانی ژیانیـان لەماڵـەوە بەسـەر دەبـەن ،وەكەمترتێكەڵاویخـەڵكی دەبـن و كـەمتر شارەزایی گۆڕانكارییەكانی ڕۆژانەن،ئەگـەر بێـت و ڕۆژانـە لـە ماڵـەوە یـان لـە دائیرەوە فەرمانگەكان یان لە زانكۆ و پـەیمانگاكان ئافرەتـان زیـاتر خۆیـان مەشـغول نەكـەن بـە شـتێكەوە كـە سـەرقاڵیان بكـات و بیریـان لـەلایی شەهوەتیان نەمێنێت وەكو خوێندنەوەی پـەرتووك و ڕۆژنامـەكان و گۆڤـارە سودبەخـشەكانی ڕۆژانـە و گـوێگرتن لـە بەرنامـەی سودبەخـشی ڕادێـویی و سـەیركردنی بەرنامـەی بـە پێـزی هەمـەڕەنگی تەلـە فزێنـی یـان كردنـەوەو سەیركردنی ماڵپەڕی سودبەخش لە تۆڕی ئینتەرنێتی جیهانی ئەمانە لە لایەك و یارمەتی و هاوكاری دایك لە ڕاپەڕانـدنی ئـیش وكارەكـانی ڕۆژانـە و خـاوێن كردنـەوەو نوێكردنـەوەی ماڵـەوە و شوشـتنی قـاپ وقاچـاخ وجـل وبـەرگ و هەروەها ئامادەكردنی چێشت و سڕینەوەی دەرگاو پەنجەرەكان و شوشتنی ناوماڵ و سەردانی هاوسیٚ وجیران لەلایەكی تـرەوە، ئـەوە ناختـان فرمانتـان پـیٚ دەكـات بـۆ ئـەنجام دانـی كـاری هەڵـەو تاوانكـاری وە بـیرت بـەلای سەدەهاكاری هەڵە وتاوان دەبات نازانی چی بكەی بێزار دەبی حـەز دەكـەی بچیتە دەرەوە حەزدەكەیی بچیتە سەربانی خانوەكـەتان و گەڕەكەكـەتان و چەندەها حەزی سەیرو سەمەرەت بۆ دروسـت دەبێـت و دەتـەوێت ئـەنجامی بدەی، بەهۆی بەرزبوونـەوەی لایـەنی شـەهوەتوو و ئارەزووەكانتـان، دیـارە كاتێك شەهوەتی مرۆڤەكان بەشێوەیەكی بەرچاو بەرز دەبێتەوە كـە دەسـت بەتاڵ بێت و خەریكی هیچ شتیٚ نەبێت، بۆیـە ئـەم دەسـت بەتاڵییـە دەبێتـە هۆكارێك بو ئەوەی بیر لە تاوان و خراپەكاری بكەیتەوە و لەوانەشـە تووشـی

تاوەنەكـەش ببیـت ، كەواتـە بـەكورتی چارەسـەریش بـۆ ئـەم كێـشە بـە شێوەیەكی ڕوون ئەوەیە خۆت سەرقاڵ بكە بە شتێكی سود بەخشەوە، پێش ئەوەی سـەرقاڵ بـوون ناچـارت بكـات تـا خـۆت سـەرقاڵ بكـەیی! ، بـەڕێزان هۆكارێكی تـر لـە هۆكارەكـان كـە باسمـان كـرد پێـشتر ئـەنجام دانـی چـەند هەڵسوكەوتێكی ناشرینە كە زۆر جار وا لە گەنج دەكات كە كاریگەری لەسـەر درووست بكات و خۆی مەشغوڵ بكات بە تـوڵوە وتـاوایی لێ دێـت پـەیوەسـتی دەكەیتبە خۆتەوە و لە كوڵت نابێتەوەو تا كاری خۆی نەكات و ئابرۆت نەبات لەبـەر ئـەوە بـەڕێزان ئاگـاداری هەڵـسوكەوت و رەفتـارو ڕەوشـتتان بـن لـە هەرشوێن وجێگەیەك بوون ، ئیشارەت و چاوەبڕكێ و هەنـدێ كـرداری تـری ناشرین ئەنجام مەدە كە گەنج پێت فێـر بێـت و زیانـت پـێ بگەیـەنێ، لەبـەر ئەوە لەكاتی قسەدا لەگەڵ هەركەسێدا بوو جوان قسەبكەو ئەوەی پێویـستە بیڵـێ بـاس وخواسلەسـەر شـتێ مەكـەن كەسـەرنج ڕابكیـشێت بـۆ تـاوان و خراپەكاری، هەروەها لەگەڵ هەموو كەسێكدا بـە ئـەدەب و ڕەوشـت بەرزبـە هەمیشە با خەڵكی بە باشە وچاكەكار باست بكەن ، لەكاتی ڕۆشـتنە رێـوەدا بە جوانی و رێك و پێكی هەنگاو هەڵبێنـە و تەماشـای ئـەملاو ئـەولایی خـۆت مەكـە، نـەبادا لـەكاتی تەماشـاكردنت بـۆ خـەڵكی وا لەئـەوانیش بكـەی كەتەماشات بكەن و لـە ئـەنجامی تەماشـاكردنەوە بـۆ یـەكتری لـە داهـاتوودا ببێتە هۆی ئەنجام دانی كاری تاوان و تاوانكاری، لەبەر ئەوە گەر تەماشـایی بەر پێ ی خۆت بكەی باشترەو وبێ كێشە ترە، كەواتە بەرێزان چارەسەریش بـۆ ئـەم هۆكـارەش ئەوەیـە كـە بـەڕێزتان ئاگـاداری هـەڵس و كـەوت و ئاكاروڕەوشت و ئەخلاقتان بن بوار مەدەن بەكەس كە سوكایەتیتان پێ بكات وتاوتەشەرتان لێ بدات و بەچـاوی سـوكەوە تەماشـاتان بكـەن چـونكە ئێـوە هەمیـشە بـەڕێزو گـەورەو ئـازیزن لـەلای كەسـانی خـاوەن هەڵوێـست و وەك

خۆتان ڕەوشت جوان ،،،، هۆكارێكی تر ئەوەیە خاوەن شكۆكانم پۆشینی جلوبەرگی ((تەنك و تەسك و كورتە)) لەلایەن ئێوەوەچونكەبەڕێزان پۆشینی ئەم جۆرە پۆشاكانە كە لەلایەن ئێوەوە دەپۆشرێت بەشێوەیەكی گشتی لایخەڵكانی دەورو بەرتان جێگەی قبوڵ كردنو وەرگرتن نییە، وەبەلای زۆربەی خەڵكییەوە واناسراوە كە هەركەسێك ئەم جۆرە پۆشاكانە بپۆشی ئەوە كەسێكی بەدڕەوشت و بەدئەخلاقە،چونكەئەمجۆرە پۆشاكانە پۆشاكی بێ بڕوایان و ئەوكەسانەن كەدەیانەوێ ئافرەت لە بەرگی مرۆڤایەتی دەركەن ولەگەڵ ئاژەلأندا هەژماریان بكەنو وەكو ئاژەڵ ڕەفتاری لەگەڵ بكەن، هەروەها ئەم جۆرە پۆشاكانە نامۆیە بە دینەكەت بە عورف وعادەت و تەقالیدی كۆمەڵگەكەت و نەتەوەكەت و وڵاتەكەت،لەبەرئەمەیە كەزۆرجار ئافرەتان و بەتایبەتی تر ئافرەتانی پۆشەری ئەم جۆرە پۆشاكانە لەناو خەڵكیدا سوك و ڕسوان و بێ ڕێزن وەبەردەوام چاوی گورگانی لەسەره سەرەتا بە تەعلیق وەشاندن ودواتر بە شتی تر ئەو ئافرەتانە ماڵی دەكەن و پاش تەواو تێ گەشتن لێیان زیرەیان لێ بەرز دەكەنەوەو ئەوەندەی تر بەر نەفرەتی خەڵك و كۆمەڵگەیان دەخەن، كەواتە چارەسەر بۆ ئەم هۆكارەش ئەوەیە بەڕێزان ئێوە هەوڵ بدەن پۆشاكێ بپۆشن كەلەگەڵ دینەك دەگونجێ ئەگەر موسڵمانی وەلەگەڵ عورف وتەقالیدی كۆمەڵگەكەت بگونجێ ئەگەر ئەهلی ئیسلام وموسڵمان نیت بۆ ئەوەی بەشێوەیەك بیت كە خەڵكی تانەو تەشەرت لێ نەدەن و بە كەسێكی بێ ڕەوشت باست نەكەن و سوكایەتیت پێ نەكە،بەڕێزان من واهەست دەكەم زۆر لەو ئافرەتە ڕەوشت بەرزانەی كە ئەم جۆرە پۆشاكانە دەپۆشن پێ ی ڕازی نین و پێیان ناخۆشە كاتێ دەیپۆشن بەڵام بەهۆی ئەوەی كە گاڵتەی پێ نەكەن و بەكەسێكی عەشایر لەقەڵمی نەدەن ناچار بۆ ڕەددانەوەی ئەوانە مەجبور دەبن بیپۆشن، بە ڕاستی

بـەڕێزەكانم دەزانم كـەتۆ مەبەسـتت رازی كردنـی خـەڵكی یـە لـەخۆت بـەڵام دڵنیاش بە گەر كۆمەڵێكشت  رازیكردلـەخۆت بەپۆشـینی ئـەو پۆشـاكە، لـە هـەمان كاتـدا كۆمەڵێكیـشت لێ دەرەنجـی هـەر لەبـەرخاتری پۆشـینی ئـەو پۆشاكە، كەواتە بەڕێزەكەم خۆت بەراوردی ئەو دووكۆمەڵە بكە بزانە كامیان باشترە؟ حەز دەكەی كام كۆمەڵە لەخۆت ڕازی بكەی بەتایبەتی كـە بـەڕێزت ڕەنگە موسڵمان بیت و لەدینەكەی تۆشدا كەئیسلامە فەرمانت بەوە پێكراوە كە دەبێت پۆشتە بیت و بەرامبەر ئەوەش مژدەی بەهەشتت پـێ دراوە گـەر بەردەوام بیت لەسەر پۆشـینی ئـەو پۆشـاكە شـەرعییەی كـە بـۆت دانـراوە، دوایی ئەوەش بزانە كاتێ تۆ ئەو پۆشاكەدەپۆشیكە((تەنك وتەسـك وكورتـە تاچەندێ دەروونت مورتـاح و ویـژدانت سـەلامەت و لاشـەت ئیـسراحەتە؟ تـا چەندێ دڵخۆش كاتێ ئەوپۆشاكەدەپۆشیت و هەموو لاشەت بەدەرەو هـەموو كەسێ تەماشات دەكات و تانەو تاشەرت لێ دەدەن ؟ ئایی چـەند ناخۆشـە و چـەند عـەیب و ئابرۆچـوونە بـۆ كەسـێ خـۆی بـانگی خـەڵكی بكـات و بڵـێ خەڵكینە وەرن تەماشایی گیان و عەورەت و جسمم بكەن تادەتوانن سـەیری بكەن وتەعلیق و قسەی ناشرینم پێ بڵێن ! چۆن دەتانەوێ سـەیرم بكـەن و لەناو خەڵكیدا باسـم بكـەن ! بـەڕێزەكانم بـا لـە واقیعـدا واش نـەڵێیت بـەڵام لاشەت خۆی هاوار دەكات و بانگی خەڵكی دەكات بەڵام تۆ خۆت نابیـستی و بـیر ناكەیتـەوە ولات گـرنگ نیـە، قەناعـەتتان هـەبێت بـەڕێزەكانم خـۆ ڕووت كردنـەوە واتـایی پـێش كـەوتن وشارسـتانیەت نییەئەگـەرخۆڕووت كردنـەوە واتایی پێشكەوتن بێت لە زهن و بیری هەندێ كەسـدا ئـەوە پـەرژین بێـت لـە ڕووی بەڕێزتاندا ئاژەڵان وحیوانات پێش كەوتووترین دروستكراون گەر ئێـوە هەندێ شتیشتان لەبەر ماوەبـەڵام خـۆ ئـەوان هەرهیـچیان لەبەردانیـە لەبـەر ئەوە ئێوە پێش ئەوەی هیچ شتێك بن مرۆڤن بۆ هـیچ كەسـێكیش ڕەوا نییـە

ئێوە لـە پلـەی مرۆڤاییەتییـەوە داگرێـت بـۆ پلـەی ئـاژەڵان وحیوانـات،هـیچ كەسێكیش ناتوانێ ئەوكارە بكات جگەلەیەك كەس كە ئەویش ...؟، هەروەها بەڕێزان هۆكارێكی تر كە بەرەو هەڵەو تاوانكاریی پەلكێش دەكات ئەوەیە كە ئێوە بەشەڕ بێن لە گەڵ هاوسەرەكانتان یانماڵەوەتان لەسەر كێشەیەك یان گرفتێك كە ڕوودەدات، دیارە ئەمەش لەئـەنجامی لێـك تێنەگـشتن لەیـەكتری ڕوودەدات ودەرئـەنجامێكی خراپـی لێدەكەوێتـەوە كـە ڕەنگـە لـێكترازان و لێكجیا بوونەوەی بەدواوەبێت لەداهاتوودا،یان دووركەوتنەوە و دورە پەرێزی بەدواوە بێت لەماڵەوە،بۆیە چارەسەرمان بۆ ئەم كێشەیە ئەوەیە كـە داوا لـە بەڕێزتان دەكەین كە ئارام بگرن لەسەرئەوكێشانەی كەڕوودەدات لەنێوانتاندا وە هەوڵبدەن لەیەك تێ بگەن پێش ئەوەی بڕیار بدەن بەسـەر شـتەكاندا وە دواداچون بكەن بۆ هەواڵەكان كـە دەربـارەی یەكترئارەسـتەتان دەكرێـت وە پێش ئەوەی لەیەك بڕەنجێن پێویستە بـزان لەسـەر چـی لەبـەر خـاتری چـی نێوانی خۆتان تێك دەدەن وەپێویستە دوژمنانتان زیاتر لە خوتان بناسن بـۆ ئـەوەی نـەتوانێ زیانتـان پـێ بگەیـەنێ،بـەڕێزان گـەر نـەتان تـوانی بەسـەر كێشەكانتاندا زاڵ بن ئەوە بێگومان لێك جیابوونـەوە ڕوودەدات وبەیـەكجاری دەست بـەرداری یـەكتری دەبـن ، پـاش ئـەوەی كـەجیاش بوونـەوەو لـەماڵ دووركەوتنـــەوە لـــەو كاتـــەدا تاكڕەوانـــە بـــیر دەكەنـــەوەو ســـنورێك بـــۆ بیركردنـــەوەكانتان دانـــانێن تالـــەداهاتوودا دەكەونـــە داوی تـــاوان و خراپەكارییەوەو هەرئەوەنـدە كـە فێـری كـاری خـراپ بوویـت پـاش ئـەوەی كەترسـی پیاوەكـەت یـان ماڵـەوەت لەسـەر نـامێنێ ئـیتر وازی لێ نـاهێنی و دەست بەرداری نابیت تا بەیەكجاری لەناو دەریایی تاوان و خراپەكاریدا نقوم دەبیـــت و سەڕشـــۆڕو ســـەرگەردان و بـــێ كـــەس دەمێنیتـــەوە و تاكـــە هیوایەتێكیشت كە هەیە لەوكاتەدا تەنها مردنە ، كە بەڕاستی كۆتایی یـەكی

خراپە گەركۆتایی ژیانت بەوشێوەیە بێت بۆیە بەڕێزەكانم هەوڵ بدەن پێش بەم كارە بگرن چونكە لەسەرەتادا دەتوانرێ كۆنترۆڵ بكرێت هەرچەندە گەورەو ناڕەحەت بێت،بەلأم كەكارلەكاربترازێ ئەوكاتچارەسەر تۆزێك قورس و ناڕەحەتە بەلأم لەوكاتەشدا نابێت بێ ئومێد بیت چونكە گرفت نییە چارەسەری نەبێت ، ئەگەر كەسی خاوەن شارەزا ولێهاتوو چارەسەری بۆ دابنێت ،،،.......خوشكانی ئازیز یەكێكی تر لە هۆكارەكان ئەوەیە كە شەرم نەكەیت لەهیچ كەس و هیچ شتێ كاتێ ویستت كارێك بكەیت یان قسە وگوفتارێك بڵێیت ، وە دەربەسی تاوان و خراپەكاری نەیەیت لەهیچ كات و ساتێكدا ، چونكە یەكێك لە شیعارە گەورەو بەرزەكانی ژیان كە هەموو پێغەمبەران( علیە السلام) ، بەردەوام دەیان ووتەوە وئامۆژگاری شوێنكەوتوانیان پێ دەكردن ئەوەیە كە((هەركاتێ شەرمت نەكرد لەوەی كەدەیڵێیت و دەیكەیت هەرچی دەكەیت بیكە وبیڵێ ))، واتا ئەگەر هەركەسێ شەرمی نەكرد لەوەی كەدەیكات و دەیڵێت چاوەڕێ ی هەموو كاروگوفتارێكی خراپ وتاوانی لێ دەكرێت كە بیڵێت بیكات لەهەمووكات وساتێكدا ، كەواتە بەڕێزەكانم ئامۆژگاری وچارەسەرمان بۆتان ئەوەیە كە پێویستە شەرم وحەیا بكەنە دەستووری ژیانتان و وێردی سەرزمانتان و ناسنامەی كەسایەتیتان وپێناسەی خۆتان،بۆ ئەوەی بەردەوام سەربەرزو بەڕێزو سەرفرازبن و لەتاوان وخراپەكاری بەدوور بن، لە پێشدا لەخوای پەروەردگارشەرم وحەیا بكەپاشان لەئاین وبەرنامەی ژیانت وپاشان كەسانی گەورەتر لەخۆتان وەكو دایكوباوك ومام وخاڵ و مامۆستاو دكتۆرو پاشان كەسانی تر بەشێوەیەكی گشتی،چونكە بەڕێزان گەر ئێوە خاوەن شكۆوبەحیاو حورمەت بن هەرگیز ڕووت نایەت كاری خراپ و ناپەسەندئەنجام بدەی بەرامبەر هیچ كەسێ وە لەهیچ كات وساتێكدا ئەمەش باشترین خەڵات

ودیاریە كەپێت ببەخشرێت لەهەموژیاندا دیارە هەرئەمەش مەبەستەكەیە كە لەپێناویدا كاردەكەین و هەوڵی بۆ دەدەین ،،،، بەرێزەكانم دوا هۆكار ئەوەیە كە بەڕێزتان بیر لەوە دەكەنەوە ئەگەر بێت ولە منداڵییەوە هەوڵ نەدەی بۆ ئەوەی هاوسەری ژیانتان بدۆزنەوە بۆ داهاتووتان بەخەیاڵی خۆتان لە داهاتوودا كەس نایەتە خوازبێنیتان و بەگەورەكچی دەمێننەوە وئیتر كەس ناتوان خوازێت، بۆیە من وادەبینم و واهەست دەكەم هەریەكەتان لەلایەكەوە هەوڵ دەدەن هەندێكتان لە دائیرەوفەرمانگەكان هەندێكی ترتان لە زانكۆ وپەیمانگاكان وهەندێكی ترلەكولاَن وگەڕەكەكان و هەندێكی ترتان لەبازاڕەكان و هەندێكی ترتان لەرێگەی موبایل و بەرنامەی(چات)ی ئینتەرنێتەوە هەوڵدەدەن بۆ ئەوەی پیاوێك بدۆزنەوەو پەیمانیان لێ وەرگرن بۆ ئەوەی شویان پێ بكەن، بۆیە لەوپێناوەشدا زۆرجار
دەبیتە قوربانی و ناگەیتە ئامانج و مەبەستی خۆت لەبەر ئەوەی كە خۆشەویستەكەت یان بەواتایەكی تر پیاوەكەی داهاتووت خیانەت لێ دەكات و دەستت دەبڕێت،چونكە ئەمڕۆ لەگەڵ تۆدایەو سبەی لەگەڵ یەكێكی ترو دووسبەی لەگەڵ یەكێكی تردایە، بێ ئەوەی لات گرنگ بێت ئایا ئەوە كەسەی كە خۆشت دەوێت كێیەو كاری چییەو ئەخلاق و ڕەوشتی چۆنە وهەڵسوكەوتی چۆنە یەكسەر ڕازی دەبیت كە خۆتی پێ تەسلیم دەكەیی وەك ئەوەی كە ئێوە زۆر خۆتان بەكەم و بێرێزبن، بۆیە بەوشێوەیە هەوڵدەدەن وخۆتان سەرف دەكەن،خوشكە بەرێزەكانم دڵنیابن ئەم جۆرە بیر كردنەوانە زۆر هەڵەیە كە تۆی بەرێز لەوتەمەنەوە خۆتی پێ سەرقاڵ بكەی ، چونكە چارەنووسی هەموو بەندەكان بەدەست خوایی گەورەو میهرەبانە وەیە خۆی دەزانێ كێ بۆكێ باشەو كێش بۆكێ خراپەو نەشیاوە، ڕاستە هەوڵدان كارێكی پیرۆز وشیاوە بەلاَم مەرج نیە كەتۆ هەوڵ بۆ

هەرشتێك بدەی ئیلا دەبێت بەنسیبت بێت نەخێر ، چونكە تـۆ نـازانی خێـرو چاكە بە چی شتێكەوەیە ، زۆر جار تۆ حەز دەكەیت كەئیشێكت بۆ بڕەخسێ بەلاَم تەماشادەكەیی بۆت نارِەخسێ تۆ نابێت دلگران و بێـزار بیـت، چـونكە خوای گەورە لە پەرتووكی قورئانی پیرۆزدا لە ئایەتێكیدا دەفەرموێت:

﴿ وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ ﴾ (البقرة /٢١٦) .

واتە:(( ئێوە زۆرجارڕقتان لە ئیشێكە كە بۆتان بگـونجێ بـەلاَم لـە ڕاسـتیدا خێری تێدایە كە بۆتان بگونجێ ، وە زۆرجاریش حەزتان لە كارێكە كە ببێـت بەلاَم شەڕی تێدایە گەربگونجی،چونكە هەموو ئەمانـە خـوا دەیزانـێ و ئێـوە نایزانن )).

زۆر كەسمان دیت كە زۆر هەولْیان دا تاسەرنجی كوڕان بۆلای خۆیان ڕاكێشن بەو مەبەستەی كە هەیانە بەلاَم لە كۆتایدا نەك بە مەرامیان نەگەشـتن بـەلكو تەواو بێ ئومێدیان كردن پاش ئـەوەی كـە خیانـەتیان لێ كـردن، بـەڕێزەكانم ئێمە بەو شێوەیە لـە ئێـوە تـێ نەگەشـتووین كـە ئێـوە بێڕێـزو بـێ نـرخ بـن تابەزۆر خۆتان سەرف كەن، بەلكو وا تێگەشتووین كـە چـەندێ ئێمـە گـرنگ بین لای ئێوە هێندەی ئەوەش وزیاتریش ئێوە گرنگن لای ئێمە،چەندێ ئێوە هەولْدەدەن كەئێمە ڕازی بكەن تاشومان پـێ بكـەن هێنـدەی ئـەوەش ئێمـە حەز دەكەین ئافرەتێكی ڕێك و پێـك و چـاك و خـاوەن دیـن وخـاوەن شـكۆو خــاوەن حەیاوحورمــەتمان دەســكەوێت تاشــومان پــێ بكــات،خوشــكە بەڕێزەكانمان دلْنیا بن چەندێكوڕان حـەز دەكـەن كـە ئـافرەتی سـفورو بـێ ڕەوشــت مارەبكــەن وبیخــوازن ســەدئەوەندەی ئــەوە حــەز بــە خــوازبێنی ئافرەتـانی ڕەوشـت بـەرزو خـاوەن شـەرم وشـكۆ دەكـەن تـا بیخـوازن و لـە داهاتوودا ژیانیان لەگەلْ بگوزەرێنن ، وەهیچ كاتێكیش بۆ دەستكەوتنی ئەم

جۆرە ئافرەتانە كە ئەو سیفەتە جوانانەیان هەیە گوێ بەتەمەن و جوانی و دەوڵەمەندی و شەهادەو مەنسەب نادەن، بەڵكو زۆر جار خۆیان حەز دەكەن تارادەیەكیش تەمەنیان هەبێت چونكە زیاتر لە ژیان تێ گەشتوونەو زیاتر دەتوانن لەگەڵ ژیاندا هەڵكەن ، بەڕێزەكانم دڵنیابن ژن هێنان لای پیاوان تەنها بۆ تێركردنی غەریزەی جنسییان نیە وەك لای ئافرەتان زانراوە، چونكە پێش ئەوەی لەبیری ئەوەدابێت غەریزەی جنسیتێر بكات لە هەوڵی دروست كردنی ژیاندایە لە گەڵ هاوسەری تازەیدا لەهەوڵی دروست كردنی خانوو و دۆزینەوەی كاردایە بۆ ئەوەی ژیانی پڕ بكات لە خۆشی و بەختیاری و سەرفرازی لە داهاتوودا،بۆیە بەڕێزەكانم ئامۆژگاریم بۆتان ئەوەیە واز لەو بیر كردنەوە سەیرو نابەجێیانە بهێنە كەهیچ سودو بایەخێكی بۆت نیە لە داهاتوودا تۆكاری خۆت بكە و خۆت سەربەرزو ڕەوشت بەرز ڕابگرە لە ئێستادا كۆتایی كارەكەشت و داهاتووی خۆت بە خوا بسپێرە چونكە ئەو زانا و كاربەجێیەو خەیاڵت تەخت و ئاسودەبكە چونكە خوای پەروەردگار بەندەكانی خۆی هەرگیز لە یاد ناكات بە مەرجێ تۆش لە هیچ شوێن و كاتێكدا ئەو لە یاد نەكەی ،، بەڕێزەكانم خوشكانی ئازیزم ئەمە لە گرنگ ترین ئەوهۆكارانە بوون كە ئێوەی گوڵ بەرەو تاوان و كاری خراپ و نابەجێ ڕاپێچ دەكات ، وە دیسان ئەمە لە گرنگ ترین ئەو چارەسەرانە بوون كە وەكو ڕێگە چارەیەك بۆ وازهێنان و خۆپاراستن لە تاوان وكاری هەڵە پێش كەشتان كرا،ئومێدە وارم توانیبێتم خزمەتێكی ئێوەی خۆشەویست و بەڕێزم كردبێت و وەكو خزمەت كارێك لە خزمەتتاندا بوویێتم لەم ماوەیەیی كە ئەم نوسراوەم بۆ نوسین، وە ئومێدەوارم ئەمناملكەیە جێگەی سودو ڕەزامەندی ئێوی بەڕێزم بووبێت وە هۆكارێك بێت بۆ گەڕانەوەی خوشكانی بێ ئاگامان لە ئەنجام دانی كاری هەڵەو تاوانكاری بۆ سەر ڕێبازی ڕاستی و

بەختەوەریو خۆشبەختی و ئاسودەیی، کەئاواتی گەورەو بەرزی منە ،،،،
بەرێزەکانم پاش ئەوەی کە هۆکارەکانی تاوان و خراپەکاریت زانی کە بەشێوەیەکی گشتی کە باسمان کرد ، پێویستە ئێوە لەمەودوا زیاتر لە هەموو کاتێك ئاگاداری خۆتان بن و چاودێری یەکی بەردەوامی خۆتان بکەن لە هەموو ڕووەکانەوە وە پێویستە پەیڕەوی چارەسەرەکان بکەیت و بەجوانی و ڕێك و پێکی جێ بەجێ یان بکەن ، بۆ ئەوەی هەمیشە بە سەربەرزی و بەختەوەرانە بژین ، وە بە ڕێزەکم دەمەوێت لەدوا پەیڤ ودێڕی ئەم نامیلکەیەدا هەندێ ئامۆژگاری سودبەخشتان بەشێوەیەکی گشتی پێشکەش بکەم تا وەکو گوڵێکی جوان بە دیاری لێمی وەربگرن و ببێتە مایەیی دڵخۆشی و ئاسودەیی ئێوە لە داهاتوودا ، خوشکانی ئازیزم بزانن کە هەریەکە لەمرۆڤەکان لەهەوڵی ئەوەدان کەهەمیشە سەرکەوت و بەختەوەربن وە هەریەکەیان بەشێوازێك و بەڕێگەیەك هەوڵی بەدەست هێنانی ئەدەن ، جا هەیانە سەرکەوت و دەبێت هەشیانە فەشەل دەهێنێت ، جائەوەی لەسەر ئێوەیە بۆ ئەوەی سەرکەوت و بن بڕوا بەخۆبوونە کەگەورەترین وکاریگەرترین هۆکارو ڕێگەچارەی گونجاوە بۆ سەرکەوتن وسەفرازی لە هەموو کات وساتێکدا وە لەهەموو شوێن وجێگەیەکدا ،بزانە کە هەرکاتێ هیوا (بڕوابەخۆبوون) لە ژیاندا کۆتایی پێ هات ئەوکات مردنی حەقیقی دەست پێ دەکات، وە هەمیشە دەبێت لەهەوڵ و کارکردندا بیت لە ژیاندا هیچ کاتێ لەهەڵە کردن مەترسە و بیریشی لێ مەکەرەوە کاتێ ویستت کارێکی شیاو و گونجاو یان قسەیەکی چاك وسودبەخش بکەی یان بیڵێ ی،چونکە شتی شیاو بۆ شوێنی شیاوە، وە گەورەترین هەڵەش ئەوەیە کەتۆ بەردەوام بیر لەهەڵە کردن بکەیتەوە لە سنوری کارەکانتدا، کەواتە بۆ هەموو کات وساتێ بڕوات بەخۆت هەبێت و هەرگیزمەویست مەبە لەهەوڵدانت بۆ بەدەست هێنانی

حەزێك یان خۆزگەیەكت كە واقعی و گونجاوە بۆ ڕوودان،هەروەها نەبوونی ئامانج وكارنەكردن بۆی لە ژیاندا گەورەترین و سەرەكی ترین كارە كە مرۆڤ بێ ئومێد و ڕەش بین دەكات، جا بۆ ئەوەی بەئاسانی بتوانین ئامانجەكانمان دەست نیشان بكەین، باشتر وایە تەماشایی بەرهەمەكەی بكەین بزانین دەمان گەیەنێتە شوێن ومەبەستی شیاو،ئەمە گەورەترین و سەرەكی ترین خاڵە كە مرۆڤە ژیرو هۆشمەندەكان پەیڕەوی دەكەن ، وەتۆ ئێستا گەشتیتە قەناعەت كە ئامانجت دەست نیشان بكەیت ، بەلاَم لێرەدا تۆ دەبێت بەرنامەو نەخشەت هەبێت بۆ ئەوەی چۆن هەنگاو بهاوێژیت وڕۆژانە نەخشەكە لە گەشتن بە ئامانجەكانت نزیكت بكاتەوە، بۆئەمەش جوانترین وباشترینەنەخشەبۆ هەرئامانجێك و هەر سەركەوتنێك پێم وایە هەر ئەم چوار خاڵەیە :—بڕیار دان لەسەری ،،، كاركردن لەسەری ،،،،، بەردەوام بوون لە سەری ،،،، ئارام گرتنە لە سەری ،،، وە ئەوەش بزانە كە گەورەترین جیاوازی لە نێوان مرۆڤ وئاژەڵدا تەنها لە ئەقلّ و هۆشدا نیە، بەڵكو بڕیاردان وئیرادەیە،،وەئەوەشبزانن كە مهارات ولێهاتووەكان ٪١ی خواكردیە لە ٪٩٩ ی بەرهەمی هەولّ وكۆششكانە، متمانە بەخۆبوونیش یەكێكە لەوشتانەی كە بەهۆی هەولّ وكۆششانی زۆر بەدەست دێت ، ئەوەتا لەهەركەسێكی سەركەوتوو بپرسی چۆن گەشتیت بەوپلە بەرزو سەركەوتنە لەوەلاَمدا دەڵێت:(دوایی تێپەڕ بوون بە دەریایەك لە كێشەو كۆسپ و بەربەست پاشان گەشتم بە كەناری سەركەوتن وئارامی)،كەواتە بەڕێزەكانم ئێوەش هەولّ بدەن بۆ بەدەست هێنانی ئەوسیفەتە جوانە كە متمانە بەخۆبوونە و هەرگیزدەست بەرداری مەبە چونكە بڕوا بەخۆبوون واتایی هەست كردن بەبوونی خۆت ، هەركەسێكیش هەستی بە بوونی خۆی كرد ناهێڵێ هەرگیز

خۆی وون بكات، ئێستا چەند ڕێگەیەكت پێ دەڵێم كە زیاتر متمانەت بەخۆت پێ پەیدا دەبێت لەو ڕێگایانەش :

١- ناسینی خود (واتا زاتی خۆت) و دەست نیشان كردنی خاڵی لاوازو بەهێزی ناو ناخی خۆت .

٢- كێشانی وێنەو دیاری كردنی شێوازی ئەوكەسایەتییەی كە دەتەوێت بیبینی ، لە هزرو بیرو مێشكی خۆتدا.

٣- بوونی ئامانجی هەرەبەرزو هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانیان.

٤- هەست كردن بەبەرپرسیاریتی بەرامبەرخواو پاشان خەڵكی

٥- هەست كردن بەرامبەر پێویستی و گۆڕانكاری.

٦- بەردەوامی و كۆڵنەدان.

٧- بەردەوام بیر لە سەركەوتن بكەوەو وەكو ئەوەی كە هەرگیز تووشی شكست نابیت .

٨- چاو لە كەسانی سەركەوتوو بكەو سود لەئەزموونەكانیان وەربگرە.

٩- سەرەتا بۆ ئەوەی كارە قورسەكانیشت بۆ ئاسان بێت لەو شتانەوە دەست پێ بكە كە جێ بەجێ كردنیان ئاسانە .

١٠- بەحیكمەت وكارجوانی وژیرانە ڕووبەڕووی كاردانەوەكان وفشارەكان ببەوە .

١١- هەردەم لە كارەكانتدا پێش بینی بەدەست هێنانی شتی قورس و سەرسوڕهێنەر بكە .

١٢- لەخۆپرسینەوەو بەخۆداچوونەوە .

١٣- گرنگی دان بە كورتی وپوختی لەكاردانەك زۆری و بۆر

١٤- فێری ڕاوێژكردن بە خەڵكی بەوخۆتی لەسەر ڕابهێنە .

١٥- دانانی نەخشەو پلان بۆكارەكانت بەبەردەوامی .

بەڕێزەكانم كاتیّ ئێوە توانیتان متمانەودڵنیایی بۆخۆتان پەیدابكەن ئەوكات چاوەڕوانی زۆر شتی گەورەو سودپەخشتان لیّ دەكرێت سەرەتا بۆ خۆتان پاشانیش بۆ چوار دەورتان،كەسێك متمانەی بۆ دروست بووبێت هەرگیز لە هەوڵدانی بۆ بەدەست هێنانی كەسایەتییەكی بەڕێزوسەربەرز كوڵ نادات وكاتێكیش گەشت بەو پلەیە هەرگیز دەست بەرداری نابێت، بۆیە بەڕێزەكانم فێری ئەوەبە كەخۆت ڕابهێنیت لەسەر ئەوەی كە بە متمانەوە هەنگاو هەڵنێیت بۆكارەكانت بۆبیركردنەوەكانت بۆ خۆزگەكانت، هەرگیز خۆت بەكەسێكی ژمارە دوو لەقەڵەم مەدە و خۆت مەدە دەست نەفست و مەبە دیلی ئارەزووەكانت و لەواتایی ژیان(بەڕاستەقینەیی)، تێبگە،جارێكی ترسەربەرزیبەبەردەوامی، بە ختەوەری بەبەردەوامی، ئاسودەیی بە بەردەوامی ، سەركەوتنتان بەبەردەوامی بەئاوات بۆ دەخوازم و هەروەها دەریایەك لە ڕێزوخۆشەویستی و وەفاداری و دڵسۆزیتان بەدیاری پێشكەش دەكەم و هەمیشە سەركەوتنتان بە ئاوات بۆ دەخوازم...

(سبحانك اللهم وبحمدك لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب اليك)

صلاح فائق مردان
٢٠١٠/١٢/١٢ ز
چم چماڵ – شەوی شەممە
چاپی دووەم

plansaze@yahoo.com